شیعر

# هەناسەکانی زاهیدێك

سەروەر کەریم

پێشکەشە

- ❖ بە رۆحی باوکم
- ❖ بە خەزان


کتێب: هەناسەکانی زاهیدێك

شیعری سەروە کەریم

بەرگو مۆنتاژ: ئەندێش دیزاینەر

تیراژ: 500 نوسخە

ژمارەی سپاردن: (78)ی ساڵی 2007

## پێشەکیەکی کورت

دنیای ئەدەبی بەهەموو حەقڵەکانیەوە ( شیعر – چیرۆک – ڕۆمان ) ، دنیایەکە پڕلەئەفسون و نهێنی و گوزارشتێکە لە هەست و نەستەکانی مرۆڤەکان و لەڕێگەی نوسینەوە دێتە بوون ...

کۆمەڵە دەقی ( هەناسەکانی زاهیدێک ) ، بۆخۆی زادەی بیرکردنەوەی تاکێکە لەکۆمەڵگاو هەست ونەستەکان و ، لەڕێگەی زمان و هونەری ڕێکخستنی ووشەو واتاسازیەوە دەیەوێت .

گوزارشتێک لەمانا بکات و کێشەکانی بوون لەنەبوون داو ، نەبوون لەبوون دا گوزارشت بکات و لەوێشەوە بچێتە دنیای عەشق و گوزاشت لەعەشق بکات ...

ئەم کۆمەڵە دەقە من ناتوانم هیچ ناوێکی دیاری کراوی لێ بنێم ، ئەوە بۆخوێنەر بەجێ دەهێڵم چ ناوێکی پێدەبەخشێت ...

سەروەر کەریم

سلێمانی 2 /2/2007



## نامەیەک بۆ مەنفا

### لەروانگەی پیاوێکی نیشتەجێی مەنفاوە ...!!!

هاوڕێم ...
ئێرە ولاتی تاجەگوڵینەو ئەستێرە پرشنگدارەکانی ئازادیی یە ،
لێرە سەمفۆنیاکانی غوربەت نامۆیە
شەقامەکان و کۆڵانەکان پڕن ،
لەڕێبواران و سەرگەرمی شادین و،
بادەی ژیان دەنۆشن ...
ئێرە ولاتێکە کەمرۆڤ لەدەرەوەی پیرۆزکراوەکان بوونی هەیە .
دارتێل و کۆشکەکان هێندەی سەرنجی ورۆڤە کان دەبزوێنن ،
چەند مانگێک تێرنابی لەتەماشاکردنی وێنە جوانەکانی .
لێرە خۆشەویستی ئەفسانەیە و یاساکان بەربەست نین .
بولبولەکان بەبێ پاسپۆرت لەسەر دارئەرخەوانەکان دەخوێنن
سەیرانگاکان هیچ چاوێکی سانسۆری لێ نییە ،
هیچ کەسێک گوڵەکان ناوەرێنێت و پەپولەکان هەڵنافڕێنێت .
هاوڕێم ...
ئێرەئەو وێستگەیەیە کەشەمەندەفەر ژیان ئارامی تیادەگرێت

لەدوای دابەزین لەخۆرئاوا پڕ بەگەرووی سانسۆر ئازادی هەڵدەمژێ ،
بەبێ ئەوەی بپرسن تۆ تۆچ ڕەگەزێکی ،
هەموو ئەم ووشانە بۆکەسێکی خۆرهەڵاتی ڕاستە کەئاشنا نەبووە
بەخۆرئاوا .
ئەو دەمانەی کەئاشنادەبیت ،
لەوێش زۆرجار ئاوات دەخوازیت بۆ سەمفۆنیاکانی غوربەت .
بولبولەکان دەنگی خوێنینیان لەلات دەبێتە هاوارێکی ترسناک
شۆستەو شەقامەکان و کۆڵانەکانی بێدەنگی چاوەڕوانتە .
ژیان لەلات دەبێتە بێ هودەیی و بێزاری لەشەڕنا ،
لەکارەسات نا ،
بەڵکو لەبێ دەنگی و چاوەڕوانی و تەنیایی ..
بێ دە نگیەک کەسەرتاپای‌بونیادی جەستەو ڕوح و،
ووێنەکانی بەرچاوت دادەگرێت ..
ئیدی مانایەک بۆ ووێنە جوانەکانی خۆرئاوا نامێنێ .
قەدەر فەنابوون ،
ئاوابوونی دەنگە خۆشەکان لەخۆرئاوا ..
ئیدی ڕوو کردن بەناو کۆڵانە ساردو سڕەکانی ،
شارستانی دا بێ بێ مانا دەبێت
ژیان دەبێتە ڕوکەشێک لەلات و ،
لەگریانی دوای کارەسات دەچێت ...
گریانێک هێندە بەکوڵ ،



لەکۆست کەوتنی دایکێک دەچێن ،
بەسەر کۆرپەی مردوویدا بگری ...
یان هێندە بێزارو بچوکیت ،
وەک پاڵەوانی ڕۆمانی سڕینەوەی کافکات لێ دێ و
دەبیتە قالۆنچەیەک ناتوانیت بۆ ساتێک ئارام بیت ...
هاوڕێم ...
میهرەجانەکانی کان و ئۆسکار و،
نمایشی دانسی یانەکانت لێ دەبێتە سسیناریۆیەک و
بێ ئاگایانە خەنی دەبیت ...
دوای کۆتایی هاتن پڕبەدڵ دەگریت ،
چونکە ناتوانیت ئەو دەورە گاڵتەجاڕیەی بینیوتە لەبیری بکەی .
ئیدی ئەمە حەقیقەتەو ناتوانی خۆتی لێ بشاریتەوە .
سەماکانی خۆش نودی لای تۆ کۆتاییان هات .
ناتوانیت بەئاوازەکانی ڕۆکی خۆرئاوا خەنی بیت .
چونکە عەشق لەدرۆ ناکرێ ...
هاوڕێم ...
خۆرهەڵات ئەوزامە گەرەیەیە ،
کەسەرتاپای بوونی تۆی داگیر کردوە .
عەشق لەخۆرهەڵات خوێنی لێ دەچۆڕێ و ،
بەچاوی پڕلەگومانەوە لەتۆ دەڕوانن .
من دەزانم ئێستا تۆش زۆربێزاری ،

لەوژیانەی بەسەری دەبەیت لە بێهودەیدا ...

ئیدی ئەمە حەقیقەتەو خۆرئاوا ،

ئەو کەژاوەیە نەبوو تۆ ی تیا ئاسودەبیت ...

یادگاری و سۆزی هاوڕیان بەجێ بهێلی و،

بلێت رابوردو لەلای من تەواو بوو ...

ئێمە یادەوەری سەرتاپای بوونی داگیرکردوین و ،

ناتوانین بەبێ یادەوەری بژین ...

ئەودەمانەی تۆ لەخۆرهەلأت لەناو ئازار دا دەژیایت ،

هیوایەک هەبوو بۆ عەشق و ژیان ،

بەلأم دوای سەفەر هیواکانت ،

لەمادەیەکی بێهۆشکەردا تواندەوە .

خۆرئاوا ئەو دراوە ئەلەکترۆنیەیە ،

کەئێمە ناتوانین کایەی تیا بکەین .

هەوڵدان بۆیەکانگیر بوون لەگەڵ ئەوێ بێهودەیە .

ئەفسوس کەناتوانیت وەک ئەوێ بیر بکەیتەوە ...

ئەفسوس چەند ئەستەمە بەچاوی بێمانا بوونەوە ،

لەهاوڕیان و عەشق بڕوانیت ...

ئەزانم ئێستا دەڵێت من وانیم ،

بەلأم ئەمەحەقیقەتی بوونی تۆیە لە خۆرئاوا ...

ئەفسوس من لەناو دڵتام ،

بەخەیاڵ سەرجەم ئەوبیرانە شیدەکەمەوە ،



کەبەمێشکدا گوزەر دەکەن .

ئەودەمانەی تۆ بەهیوای عەشق دەژیای ،

کەسێکی زۆر ڕاست گۆ بووی ، وەک بیر و هەست ...

دوای سەفەر هەموو بەهاکان ،

لەخۆرئاوا تێکەڵ بەدەنگەنوساوەکانی ،

دوای هەڵدانی چەند پێکێکی ناوبارەکان بوون ...

بەزمانێکی نیوە لاڵەوە ،

دەڵێ ئێستا عەشق درۆیە

ساتەکانی لەزەتی خۆرئاوا ژیانە سۆزە ...

ئێستا من کڕنۆش بەری بەر قاپی مەیخانەیەکی خۆرئاوام و،

بەستراومەتەوە بەوێ وە جوانیەکان کۆتایی هات ...

ساتەکانی عەشق و وەفا گوزەشت .

من خۆم باخچەکانم وێرن کردو ،

گوڵەکانم لەڕەگەوە هەڵکەند ...

فەلسەفەی سۆزو ژیانم لەبەر پێی خۆرئاواییەکدا سوتاند ،

من لەناو دڵتام

ئێستا دەڵێ ئێوە زۆر هەڵەن ،

کەباسی گوڵە سورەکانی عەشق دەکەن ،

لەخۆرهەلأت گوڵی سور نارِوێ ...

بولبولەکان ناتوانن بەئازادی گورانی بۆژیان بڵێن ...

سلێمان1997/10/20

## نامەیەک لە مەنفاوە ... !!

هاوڕێم ...

خەون بینین بەکەنارەکانی خۆرئاواوەو،

ڕەوکردن بەنێوکۆڵانەساردوو سڕەکانی شارستاندا

پانتایی بیرکردنەوەی لاوانی داگیرکردووە

نمایشی دانسی ناو یانەکانی خۆرئاوا

سەرشێتانە ڕاپێچی خەونەکانی ئەوێت دەکات ،

بەحەزێکی زۆرەوە فرمێسکی بۆ دەڕێژی و ،

دەخوازیت بۆساتێک بێت بگەی بەوێ و

نیگای کچە جوانەکانی ناو باخچەکانی بکەیت ،

یان بەئازادی بۆ چەند ساتێک لەیانەکاندا

پێکی شادی و موحیبەت بنۆشی و،

لەمەستیا دەست لەملی کچە جوانەکانی ئەوێ بکەیت

دوور لەچاوی سانسۆری کۆمەڵگا ...

هاوڕێم ...

خۆرئاوا خەونێکی ڕووکەش و دوورە

هەموو شتەکان لەوێ ئاوەژوون

نیگاکان دوورن لە سۆزوو خۆشەویستی

کۆڵان و شەقامەکان ڕەنگی مردوویان گرتووە

هاوڕێیەتی پەیڤێکی سواوی ناو فەرهەنگەکانە و ،



حەقیقەتی مرۆڤ بەبێ وەفایی سپێردراوە .

دانسی ناویانەکان نمایشێکی درۆزنانەیەو ،

تەنهاو ... تەنها فریودانی زاکیرەی ئێمەیە ...

هاوڕێم ...

خۆرئاوا پێناسەی گوزارشتێکی گرانە

مرۆڤ بەرلەگەیشتنی بەکەنارەکانی ئەوێ

بینایەکی گەورە لەخەون درووست دەکات و،

هەموو پێناسە جوانەکانی پێدەبەخشێ .

وەلێ ئەفسوس خۆرئاوا لانەی وێرانەیە ،

شوێنی سڕبوونی مرۆڤ و داڕوخانی خەونەکانە

لەدەروازەی خۆرئاوا بەخەتێکی گەورە نوسراوە ،

ئێرووڵاتی بەرمۆدای خەون و بێهدەییە

ناسینی کەنارەکانی بۆ خۆرهەڵاتیەک ئەستەمە

لێرە هەموو شتەکان یادەوەریان لێ زەوتکراوە

سۆزوخۆشەویستی بەقەدەرو تەنهایی سپێردراوە .

لێرە ئاوازەکانی ڕۆکی و وێنە جوانەکان

ئەفسون و تەلیسمی تەنهاییە بۆ خۆشەویستی .

لێرە مرۆڤەکان بێ پەروا فرمێسک دەڕێژن و

دەگەڕێن بۆ ساتێک دوور لە قەدەر ...

هاوڕێم ...

دڵنیام پەیڤەکانم نیگەرانت دەکەن

هێدی .. هێدی خەونەکانت بەوێ هەڵدەوەرێ و،
دەڵی خۆرئاوا لانکەی مرۆڤــ و ئازادیە
هەموو خەونەکان حەقیقەتن
بولبولەکان بەئازادی گۆرانی بۆ ژیان دەڵێن
شەقامەکانی غوربە نامۆیە
سەیرانگاکان هیچ چاوێکی سانسۆری لێ نییە و،
هەموو سنوورەکان والآیە ....
هاوڕێم ...
ڕوانینی دوور بۆ ئامێزی گەرمی ئەوێ
دابەزین لەوێستگەکانی نامۆیی و ،
گەیشتن بەکەنارە ساردوو سڕەکانی تەنهایی
کەوتن لەناو بارەکانی خۆرئاواو ،
مەست بوون بەچەند پێکێکی شەراب
ئاشنا دەبیت بەهەناسە ساردەکانی و ،
بەزمانێکی نیوە لاڵەوە دەڵێت ،
خۆرئاوا ئەوتەلیسمە ئەفسوناویەیە
ڕەوکردن بەنێو شارستانیەتی دا وونبوونە و
داخستنی دەروازەکانی عەشق و خۆشەویستیە .
مرۆڤـ دەبێتە کۆیلەیەک و
ڕۆژانە لەسەرابدا چاوەڕوانی فریاد ڕەس دەکات ...
سلێمانی 2000/4/15



## نامەیەک لەنێوان ئێرەو مەنفادا ...!!

هاوڕێم ...
کۆچی لەناکاوی تۆ بەرەو مەنفا
هەڵگری دنیایەک پرسیارو نهێنی بوو .
ڕۆژانە وێنەکان برینی یادگاریەکانی شاریان دەکولانەوە
نیگای کچە شۆخەکان و قاقای پێکەنینی ئێواران ،
شەقامەجوانەکانی عەشق و ئەڤین ،
پیاسە هێمنانەکانی ناوباخچەکان و
نمەبارانی ئێوارانی پایزو وەرینی گەڵآزەردەکان
سەمفۆنیایەکی پڕلەسۆزی لەناو دڵمان دەنەخشان .
هاوڕێم ...
ئەودەمانە ئێمە دوانەیەکی عاشق بووین
هەموو شتەناشرینەکان ماڵئاواییان کردبوو .
وەلێ ئێستا ئەم شارە ...!
تەواو سیماکانی گۆڕاوەو ئاسمانی خۆڵەمێشی دەنوێنێ .
شەقامەکان بوونەتە مارێکی ڕەشی نوستوو ،
تەنها جەستەمردووەکانی تیا دەبینرێ .

ئێستا ئێوارانی شار چۆڵە

باخچەکان بوونەتە سەراب و وێرانە

نیگایەک نەماوە بۆ جوانی و عەشق

ڕۆژانە وانەکانی نامۆیی ئەزمون دەکەین

خەونەجوانەکان هەمووی بەسەر چوون

ئێوارە پایزیەکانی عەشق نخرۆبوو

کەس بۆوەرینی گەڵاکان ناگری ...

هاوڕێم ...

هاوڕێم ماڵئاوایی کردن لەزەمەنی پەپولەو عەشق

کارەساتە ... کارەسات

ئەودەمانەی شەقامەکان دەبنە قەبرسان و ،

ئەژماری یادگاری کچە کوژراوەکانی شاردەکەین

کوچەو کۆڵانەکان سیمای خوێن دەگرن و،

میحرابەکان زیاد دەکەن .

پەڵەخوێنی ڕژاوی ناوشەقامەکان دەژێنەوە

جەستەبێنیگاکان ڕووەو گۆڕستانی زەمەن هەنگاو دەنێن .

کەس ئاشنا نی یە بە عەشق .

ئێوارانی شار تەواو خامۆش و بێ دەنگە ،

تەنها جەستە نامۆو تەریوەکان نەبێ ،

بەبێ دەنگی دڵی شەقامە بەخوێن سوور بوەکان لەت دەکەن ...

هاوڕێم ...



ئێستا زمانم گۆناکات

پەنجەکانم توانای گرتنی قەڵەمیان نەماوە

چەند پەیڤێک لەسەر لادیواری عەشق بنوسێ و

یادگاریەکی نوێ بەشەقامە چۆڵەکانی شار ببەخشێ ،

پیاسەیەک لەگەڵ پەپوولەکان بکات و

بەبێ دەنگی بۆوەرینی گەڵای پایز بگری و

تەنها عاشق لەوەرینی گەڵای پایز دەگات .

ئەستەمە عاشق بێ پایز بژی و

هێمنانە لەئێواران دا دەست لەملی باو نمەی باران بکات .

ئەم شارە هەموو شتەکانی دۆڕان

کچەکان پاکیزەیی و عەشقیان دۆڕان .

کوڕەکان وەفاو ژیانیان دۆڕان .

لەپرسەی دۆڕانی جوانی و پایزدا

ڕووەو سەراب هەنگاو دەنێن

هەموو شتە جوانەکان ماڵئاواییان کرد ...

هاوڕێم ...

ئێمە دۆڕاین ...هاوڕێم دۆڕاین

ئەودەمەی لەگەڵ پایز پرسەمان نەگرت و

شاگەشکە بووین بەخوێنی ڕژاوی گەڵاکان

ئێمە خۆمان دۆڕان خودامان دۆڕان .

ئەودەمانە مزگەوتەکان کرانە تیاترۆخانەو

بارەکان کرانە جێ نزرگەی نوێژکەران .

بەبالای شارێکی شارێکی پڕلەکارەساتماندا هەڵدەدا ...

ئەودەمانە ئێمە دەمێک بوو دۆڕابووین ،

کەنەماندەزانی ئیبلیس لەچی وبۆچی یاخی بووە ؟

قوربانی فێڵە وونەکانی مزگەوت و

شەڕە دۆڕاوەکانی سیاسەت بووین .

هاوڕێم ...

دۆڕانی ئێمە لەوێوە دەستی پێکرد ،

کەشەڕی پەپوولەکانی عەشقمان کرد

بەدەم تریفەی مانگەوە گۆرانیمان بۆژیان نەدەچڕی .

خۆمان دایە دەستی قەدەری پیاوە شەڕانیەکان ،

ئەوانیش کەشتی ژیانیان لەسپێدەیەکی بەیاندا نغرۆکرد

ئەو دەمەی بەوەفای سیاسە دڵخۆش بووین و

بازرگانەکانمان بەدڵسۆزی شار دەزانی

ئێمە نەوەیەکی گێل و دۆڕاو بووین .

ئەفسوس ... ئەفسوس

ئێمە دوور بووین لەژیانی ئینسانی و

مێگەلی بەردەستی هەموو بازرگانەکان بووین ...

سلێمانی 2000/11/16



تێبینی :

ئەم دەقە سێیەمین دەقە کە هەرسێکیان دەبنە دەقێکی تەواو کرو گوزارشتە لە دیاردەی کۆچ و ئاکامەکانی . دوو دەقەکەی تریش ئەمانەن

1- نامەیەک بۆمەنفا لەڕوانگەی پیاوێکی نیشتە جێ مەنفاوە

2- نامەیەک لە مەنفاوە

# سەمایەک لەگەڵ
# ڕۆح دا ...

.

زەمەنێک بوو ئاسمانی ئێرە

ئەستێرەکانی لە خۆی تۆراندبوو

مانگ لەپرسەی نەمانی ئەستێرەدا

ڕەنگی سوور هە ڵگەرابوو

بەدوای دواین پێکی تەنهایی دا

گوێمان بۆسەمفۆنیاکانی نامۆیی ڕادەگرت.

خەونمان بەهەڵهاتنەوەی ئەستێرەکانەوە دەبینی.

وەلیٚ جەخار،لەئاسمانی ئەم شارەدا

خەون بینین بیٚ مانایە.

ئێمە نەمانتوانی لەگەڵ تریفەی مانگ یاری بکەین

شاگەشکەبین بەخۆشەویستی مانگ وئەستێرەکان.

ئیدی چۆن بتوانین لەمانای خۆشەویستی بگەین

لەشارێکی وێران و خامۆش دا !

ئێمە زەمەنێک بوو دۆڕابووین !

وانەکانی شکستمان ئەژمار دەکردو،

بەشوێن سایەتاریکەکانی ژیاندا دەگەڕاین



خەونەکانمان بۆسەرمەدی وعەشق لەبارچوو

بەباڵای تاریکیماندا هەڵدەدا

بەدوای محرابەکاندا سروودی تەنهایمان دەچڕی و،

فرمێسکمان بۆسەربڕینی ئەستێرەکان نەڕشت .

ئەودەمانە،ئێمە نەوەیەک بووین لەوێرانە

دڵمان هەرگیزماناکانی عەشقی نەدەزانی و،

لەوەهمی سۆزدا ،دەژیاین

هەستەکانمان نەدەگەیشتنە ئاستانەی بوون

ئەوزەمەنە دواین پێکی تەنهایی پیٚ فڕکردین و،

سەرمەستانە بۆڕابوردوی بیٚ عەشق دەگریاین

سەرمەستانە نزامان دەکردبۆبینینی ئەستێرەکان و،

زاهیدانە تەوافی پەرستگامان دەکرد.

جەخار نەگەیشتین بەپێکی خۆش نوودیەو،

لەتەنهایی دا گریانێکی بیٚ دەنگمان هەڵبژار ...

ئەمێستا لەئاسمانێکی تردا

کۆترێکی سپی لەناکاو بەشەقەی باڵ

خۆی کرد بەنێو ماڵە تاریکەکانی شارداو،

لەبەر پەنجەرەی دڵمدا ئارامی گرت

بەهەناسە پێی ووتم دەروازەکانی دڵت بکەرەوەو،

گویٚ بۆڕازەکانی عەشق بگرە

بۆنی هەناسەکانی ووڵاتی گوڵ بکە —

تافێری فڕین و عەشق بیت

لەئاسمانی ئێوەدا هیچ نەماوە

کەسیش ناتانباتەوە سەر گۆرانیەکانی موحیبەت

لەشەقەی باڵبدەو رۆحت بەرەو ئێرە بنێرە،

تاچرکەکانی خۆشەویستی باڵابکات و،

لەگەڵ پەپوولەکانی رۆح یاری بکەیت.

مەستانە هەناسەبدەو زاهیدانە عەشق بکە

تاجوانیەکانی مانگ ئاوانەبێ .

سەرمەدانە گوێ بۆڕازەکانی موحیبەت ڕاگرەو،

جاویدانانە بۆنی گوڵەکانی عشق بکە .....

سلێمانی 2006/8/28



## ئەسمانێک لە عەشق و گۆرانیەک بەر لەمردن ... !؟

ئەم دەڤەرە بێ ئاسۆیە

گۆرانیەکان بۆنی مەرگیان لێ دێ

کەس بۆنی گوڵە پەمەییەکانی عەشق ناکات

شەقامەکان بۆنی هەناسەی نائومێدیان لێ دێ

سەراب و قەدەر میوانی هەموانە

چیرۆکەگەورەکانی خۆشەویستی کۆتاییان هات .

عاشقە کان لەتەنیایدا ئەسرینی نائومێدیان ڕشت و،

مەستانە بەشوێن وەفادا دەگەڕان ،

لەوسەرەوە بەدەستی بەتاڵ گەڕانەوە .

ئەوە چی قەدەرێکە ژیان پڕبووە لەگریان

خەونەکان بەتاریکی سپێردراون

باخچەکان ئێستا بێ ژوانن و،

ژیان لەئاستانەی نەبوون دا وەستاوە

سۆنگەکانی خۆشەویستی غەرقی فەنابوون بوون .

ئێستا ( مەم )* لەپرسەی ( زین ) دایەو

( وەلی )* بێ پەروا بەشوێن ( شەم ) دا دەگەڕێ .

( فەرهاد )* تاژیان بوونی هەبێت بۆ ( شیرین )

کێوی بێستون کون دەکات و خوێن لەدڵی دەچۆڕێ .

( جاک )* لەدەریای نائومێدیدا بەشوێن ( ڕۆژ ) دا دەگەڕێ ،
تا بۆجارێکی تر فێری فڕینی بکا .
( ڕۆمیۆ )* زاهیدانە ژەهر نۆش دەکات ،
تا بگاتە خەونی گەیشتنی  بە ( جۆلێت ) .
ئای کەبێ مانایە خەون
لەئاسمان و یادەوەری ئێمە دا ،
هیچ ئاسۆیەک نی یە بۆ وەفاو عەشق .
ئەستەمە بتوانین خەونمان هەبێت و ،
گوێ بۆ سەمفۆنیای وەرینی گەلاَبگرین و ،
سەما لەگەلْ هەستەکانمان بکەین .
چ قەدەرێکە ژیان ئەوەندە بێ مانابێت ،
هەموو یادەوەریە کانمان سفر بکات .
کەس نامانباتەوە سەر ژیان
هەموو ڕوانینەکان ئەندێشەی مەرگمان نیشان بدا و ،
خەونەکانمان لەساتێکی تەنیایدا هەلْوەرێنێ و
بەرەو پوچێتی ژیان و زەمەن بمانبات .
ئێمە نەمانتوانی بیر لە خۆشنودی و ژیان بکەینەوە
خۆمان دایە دەست قەدەری دلْ
مەستانە ئاوێزانی چیرۆکەکانی عەشق بووین .
زاهیدانانە چوینە ناو پەرستگای دلْ و ،
بەو پەڕی وەفاوە عەشقمان دەپەرست .



ئای چەند گێل بووین ...!
دوای خەونە پوچەکانی دلْ کەوتین و ،
لەوسەریشەوە بەناکامی گەیشتین ...
ئێمە تۆمارێک لەناکامیمان بۆ مێژوو هێنا و،
دەریایەک لەشکستی عەشقمان بینی و
نەمانتوانی دەست لە پوچێتی خەونمان بەردەین .
تائەوپەڕی ژیان مەعشوقەکانمان دەپەرست و،
ئەوانیش تادواین هەناسە  مالْئاواییان لەوەفاکرد .
مەعشوقەکان لەئەزەلەوە
یاریان بە ڕوحمان دەکردو ،
بەنیگای فێلاَویان فریویان دەداین و،
ئێمەش نەزانانە دەمانپەرستن .
قەدەری بوونمانە عاشق بین
قەدەری ژیانە ببینە هاوڕێ شکست و،
بەگەمە فێلاَویەکان ئاشنا نە بین .
( زۆر باش هەست دەکەم ئەم زەمەنە بەستەلْەکی هەست و
سۆزەکانە ،
ئاخر چۆن خۆشەویستی لەلوولەی ژەهرەکاندا
چەکەرە دەکات )* .
ئاخر عەشق سەمایە لەگەلْ ڕوح و،
گەڕانە بەنێو هەست و سۆزەکاندا .

یاری کردنە لەگەڵ جوانیەکانی ژیان ،

بەڵام کەس ئەو ڕێگایەی نیشان نەداین .

ئێمە ئاوێزانی مەرگ بووین

ڕۆژانە ڕوحی خۆمان بەرەو قەبرسان دەنارد ،

لەبێدەنگی و تەنیایدا .

جەستەی بێ رۆحی خۆما ڕادەژەن و ،

دەگریاین بۆ بێ وەفایی مەعشوقەکان .

ئیدی گەیشتینە سەرابستانی رۆح و ،

دەستمان لە گۆرانیەکانی ژیان بەردا ....

نەخۆشخانەی بەغداد 2006/11/10



پەراوێز

*مە بەست لە ( مەم و زین ) ئەحمەدی خانی یە

*مەبەست لە چیرۆکی خۆشەویستی ( وەلی دێوانە و شەم ) ە

*مەبەست لە چیرۆکی خۆشەویستی ( فەرهاد و شیرین ) ە

*مەبەست لە فیلمی تایتا نیکە کە پاڵە وانەکانی ( جاک و ڕۆز ) بوون

*مەبەست لەشانۆگەری ( ڕۆمیۆ و جوڵێت ) ی شکسپیرە

*ئە و دێڕە شیعرەی ناو کەوانە لە شیعری ( چیمەنتوی ) شاعیر ( سێوە خان ) وەرگیراوە

## هەناسەکانی زاهیدێک ...!

عەشق گوناهی سۆفیەک بوو ،
کەدوای نەزری خودا کەوت .
ژیان قەدەری دەستی مەستێک بوو ،
کەدوای شکانی شوشەی شەراب هاتە بوون .
دەریا لەبێ دەنگی دا خنکا
نەیتوانی فەلسەفەی توخبەکانی ئاو ئەزبەربکات ،
تاهەناسەی نەوڕەسەکان بناسێت و
شەپۆلەکانی خۆی بۆتەوافی ماسیەکان بنێرێت .
چ کارەساتێکە ... چ کارەساتێک
نەتوانین تەجەلای عەشق بکەین و،
هەوڵی شیکاری فیزیای ژیان بدەین ...
ئێمە لەمێژەوە * ئۆرگۆنمان وونکردوە ،
ئیدی چۆن لەیاسای وەرینی گوڵ بگەین و،
قامەتی باخچە بناسین ...
لەوێرانەی ئەم زەمەنەدا
چۆن لەماناکانی کیمیای عەشق بگەین .
لەیەکەمین ساتەکانی بوونەوە
قەدەری ئێمەبووە مەحکومی فێڵەکانی حەوابین و ،
مەستانە شوێن *بەردەکەبکەوین و ،



چاوی خۆمان ببەخشینە حەزەکانی حەواکان ...
* ئۆدیبانە فەلسەفەی ژیان ئەزبەربکەین و،
لەوسەریشەوە سەرمەدانە یاسای گریان هەڵبژێرین
بەشوێن خەونی * جەنگیزدا تەجەلای عەشق بکەین ،
تاهەناسەکان بەبەری ژیاندا بکەین .
چ گێلیەکە نزاکان بگەیەنینە ئاستانەی خودا ،
تائەویش تاوانی یەکەم بسڕێتەوەو
ئاونگی بەیانیان ببەخشێتەخەونی ئادەم ...
ئای خەونی بەسەرچووی عەشق
دەست لەبەمیحراب کردنمان هەڵگرە
ئێمە لەباخچەکانی عەدەنەوە
دەست بەرداری تەوافی گوڵ بووین ،
تایاری بەسۆزەکانمان نەکرێ ...
بەکۆترەکانمان ووت ئاسمان بەجێ بهێڵن
فڕین ناتانگەیەنێتە خۆشنودی .
لەئاستانەی خودادا شوێنێک نەماوە ،
تانزاکانی عەشق بالأبکات .
هیچ سۆنگەیەک نامانباتەوە بۆئەوێ ،
تاقانونی یاساغی باخچە هەڵوەشێنینەوەو ،
پەپولەکان سروودی یاسای گوڵ ئەزبەربکەن ...
هەموو تەجەلاکان گەڕانێکی بێ هوودەیە ،

**تاحەواکان لەهەستی لەزەتیانەوە**

**بۆنێو فەلسەفەی ژیان بچن ...**

**لەوسەریشەوە ، تادوورترین دەریا پێبکەنن ...**

**چ قەدەرێکە زاهید نزابکات و ،**

**بەشوێن پاک بوونەوەی ڕوح دا بگەڕێ .**

**چ کارەساتێکە عەشق ،**

**بەشوێن پاک بوونەوەی گوڵدا بگەڕێ ...**

**سۆفی تادواین ساتەکانی بوونی ،**

**لەبەردەم ئاستانەی خودادا تەجەلادەکات و ،**

**بەشوێن پاک بوونەوەی ڕوح دا .**

**دەست بەرداری لەزەتەکانی ژیان دەبێت ....**

**حەوایەک نەبوو ؟؟؟**

**تائاستی پاک بوونەوەی ڕوح**

**سەما لەگەڵ عەشق دا بکات و ،**

**فەسەفەی گوڵ و بەهار ئەزبەربکات ...**

**هەموو وەرزێک چاوەڕوانی ژیانەوەبکات .**

**ئەم قەسیدەیە تەواو نابێت**

**وەسێتەکانی زاهید نانوسرێ**

**فێڵەکانی حەوا ئەزبەر ناکرێ .....**

**سلێمانی** 2007 /1/7



**تێبینی :**

*** ئۆرگۆن بەمانای وزەی ژیان دێت : ولیەم ڕایش لەکتێبی ( گوێگرە پیاوی بچوک ) بەکاری هێناوە و خەبات عارف وەریگێڕاوە بۆ کوردی**

*** بەردەکە مەبەست ئەفسانەی سیزیفە**

*** ئۆدیب مەبەست ئۆدیبی پاشایە نووسینی سۆفۆکلیس و وەرگێڕانی کاکەی فەلاح**

*** جەنگیز مەبەست جەنگیز خانە : لەپێناوی مەعشوقەکەی دا بوو بە خوێن ڕێژ ، خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ڕۆمانی ( هەورەکەی سەری جەنگیزخان و ئیعدامێک لەساروزیک ) نوسینی ئتماتۆف ، وەرگێڕانی بۆ کوردی تۆفیق عەبدول**

# گەمەکانی سەراب ...!؟

ژیان وەهمێکە لەودیویاساکانی خەونەوە ،

هەمیشە دەمانباتەوە سەرسەراب و

کەنارەکانی عەشقی نیشان نەداین ...

لەئەزەلەوە ئێمە وزەی * ئۆرگۆنمان نەناسی ،

تالەمانای کیمیای ژیان بگەین و ،

ئەزموونی وەرینی گوڵ لەبەر بکەین ...

خەون بەیاساکانی باخچەوە ببینین و ،

گوێ بۆنزای ئەوکەناریانە بگرین،

کەتا دوا سروتەکانی ژیان گومانیان هەڵبژارد ...

ئێمە لەوەسوەسەی ئەوسۆفیانە نەگەیشتین ،

کەتا دواین هەناسەکان لەعەشقی خودادا توانەوە ،

لەوسەریشەوە بەبەتاڵی گەڕانەوە ...

چ قەدەرێکە ڕوانینەکان دەمانبەنەوە سەرسەراب و ،

پێناسەیەکی پێ نەبەخشین .

تا لەوەسوەسەی ئادەم بگەین و ،

فێڵە وونەکانی حەوا بناسین ...

ئێمە لەئەزەلەوە گێل بووین

تەجەلامان نەکرد یاساکانی ئاو ئەزبەربکەین و ،

لەمانای کەنارەکانی دەریابگەین ...



ئاشنابین بەقانونی گیاو ،

پاڕانەوەی ئاونگی بەیانیان لە خۆر ببینین ...

نزای * مەزدامان گوێ لێ نەگرت ،

تالەیاساکانی ئاگر بگەین ...

عەشق نەخشەکانی بوونی ئێمەی هەڵوەشاندەوە .

عەشق سەرابی نیشان داین .

عەشق ئێمەی گەیاند بەهەموو دەروازە داخراوەکان و،

ژیانی لێ تێک داین ...

نەمانتوانی لەزمانی حەواکان بگەین ،

بۆیە نەوڕسەکان نەفرەتیان لەدەریاکردو

جەنگەڵەکانی قەدەریان کردەماڵی خۆیان .

ئیدی تەجەلاکردن بۆ فیزیای ژیان

مانایەک نابەخشێ بەخەون ...

حەواکان تائەوپەڕی زەمەن

یاریان بەعەشق کردو ،

هەمووجوانیەکانی ژیانیان ئاواکرد ...

لەوسەریشەوە بەعاشقەکان پێکەنین و،

ئازاریان بەخشیە دڵی ئادەمەکان ...

2006/12/21

* وزەی ئۆرگۆن بەمانای ( وزەی ژیان ) دێت و لەکتێبی گوێگرە پیاوی بچوکی ولیەم ڕایش وەرگیراوە .

* مەزدا مەبەستم ئاهورا مەزادەیە کەلەئایینی زەردەشتی دا هاتوە : واتە خودای خێر

## مـــــــــانـــــــــــا .....!!!!

پیاسەیەک لە تریفەو دەریایەک لەڕوانین

ئێوارەیەک لەموحبەت و گۆرانیەک لەمردن

ئیدی ئەمە حەقیقەتەو ،

بەم باڵە ئاویانەوە سەفەر بەناو دارستانیٚ لە ئاگردا

ناکریٚ .

منیش بچوکتر لە گۆرانیەکانی تۆ

گەورە تر لەئاسمانی مەراق وتیژڕەوتر ، لە شەپۆلی تاڤگەکانی کەنار

دەریا

سەفەر بەنێو چەقۆ خوێناویەکاندا دەکەم و،

میلیشیایەک ، لەگۆرانی بۆپەنجەرەکەت جیٚ دەهێڵم .

میلیشیایەک لە باخچەو ،

شەڕێک جوانتر لەخەونە پەمەییەکانی عەشق ..

لەم هەواری سەرابەدا بۆتۆ جیٚ دەهێڵم

ئەمەش دواهەمین سەفەری مردنە و،

یەکەمین سەفەری عەشقە بەناو ڕاچەنینەکانی تۆدا .



من و تۆ هێندە بچوکین تارمایی جەستەمان ،

لەدڵۆپە بارانێکدا جێگەمان دەبێتەوە ...

جێگەیەک تەنهاو ... تەنها پێی دەوترێت ماڵێک لە عەشق

ژوورێک ،کەتەنها چەتری یادەوەریەکانی تۆی تێدایە ...

ئەوەش خەونی شەیتان نی یەو ،

گەرشەیتانیش بین ، ڕەنگە هێندە منالٚ بینەوە ،

بۆ قاش کردنی سێوێک بگرین .

ئێمە ،لەماناکانی سێو ناگەین ،

بۆیە عەشق نامۆیە پێمان ....

سلێمانی

# هیچ ... هیچ ... !!

قەرار بوو لەدایک ببین و
خەندە بخەینەسەرلێوی ساوایمان
گرۆگاڵ بکەین بۆ ئاماژەکان ...
ئەفسونی دایک .. باوک .. شتەکان
وێنە جوانەکانی بەرچاوی مناڵی بوون ...
پێکەنین یەکەمین بزوانی ئێمە بوو ،
بەبێ ئەوەی ماناکانی بزانین ...
ئای چ قەدەرێک بوو کەپێکەنین و
سروشتی وێنەکانمان نەناسی بوو
هەموو شتەکان لەلامان بێگەرد بوون ..
وەلێ جەخار ... جەخار
کاتێک ئاشنا بووین بەوێنەکان
شەوەکانی لەدایک بوون زۆر قێزەون بوو
سیماکان هەموویان ناشرین بوون
خەونەکانی لەدایک بوون هەڵوەرین ...
خەندەکان زۆر بەسانایی تێپەڕی و،
بەرائەتی مناڵیمان بەشەڕەکان سپارد ...



ئیدی مانایەک بۆژیان نەما
پیاوەکان ... باوکەکان نەوەیەکیان خستۆتەوە
کەهەر لەسەرەتاوە هەڵگری ساناتۆس بوون و
بۆ لەحزەیەک مانای خۆشەویستیان نەدەزانی ،
هەمیشە بەدوای ساتەکانی چێژی بێ سنوور دادەگەڕان و
نەخشەی وولاتێکی سۆزانیەتیان نەخشان
ئایەتەکانی سۆزو موحیبەتیان بەتەنهایی سپاردو
نەوەیەکی بێڕەنگ و ناسنامەیان خستەوەو ،
جەنگی کوشتنی هەموو بەهاکانیان ڕاگەیاند ...
ئیدی ژیان و مردن بوونە فەلسەفەی هیچ و،
دایکم سۆزانیەکانی لێ ئاوس بوون
بەدرۆکانی خەندەو عەشق دۆڕان و
باوکەکانیش زۆڵەکانی سەردەمی ژیان
ڕۆژانە کچەکانی خۆیان ئەتک دەکرد
لەسەر بەرماڵ و محرابی مەرگدا و ،
نەوەکانیشیان بوونە فرۆشیاری عەشق ...
ئیدی بەرائەتی مناڵی تەمەن ، قەدەرێ بوو
لەسەرابستانی زەمەن دا کۆتایی هات و
وانەکانی دۆڕان سەراپای هەموانی داگیر کرد
باوک .. دایک .. کچ ... خۆشەویستی
مامانی لەدایک بوونی زەمەنی سۆزانی بوو

ماکەکانی وەفایان بۆ هەتا ... هەتایە وونکردو ،
باوکە هەوەس بازەکانیش ناسنامەی خۆیان سوتان
نەوەکان بێ ناسنامەو بێ سۆز
پاسپۆرتی هیچێتی زەمەنیان لەبەرۆک داو ،
بۆ هەتا ... هەتایە بوونە خاوەنی هیچ ... هیچ

1006/10/10



## دڵێک لەبەرد ...!!

هارمۆنیای ژیان ئەزبەرناکرێ ،
تاماتماتیک شیکار بکەین .
گوڵ هەناسەکانی خۆی نادات بەبەهار،
تائاونگی بەیانیان ماچ نەکات .
کەناریەکان سەمفۆنیاکانی خۆیان ناژەنن ،
تائاوێزانی عاشقان نەبینن .
ئەوانە هەموویان نەخشاندنی دڵێکن ،
کەتائەوپەڕی موحیبەت
مەستانە یاری لەگەڵ ڕووح کردو ،
تادواهەناسەکانی بوون خولیای عەشق بوو .
زاهیدانە خەونی بەکەناری دەریاوە دەبینی و ،
لەگەڵ نەورەسەکان سرودی ژیانی دەچڕی .
ئەمێستا ... هیچ سۆنگەیەک نای باتەوە بۆئەوێ .
بۆ ماڵەکانی خۆشنودی .
کەس گوێ بۆ پێناسەی ئەلف وبای ناگرێ

کەس ڕازەکانی * سیزیفی بۆنادرکێنێ و ،
لەدەریای محالٚ دا
بێ پەروا سەوڵی نائومێدی لێ دەدات ...
جەخار کەشتیوانێکی نەشارەزایەو ،
هەرگیز ناگاتە کەنارەکانی ئەوێ ،
تاشەپۆلەکانی دەریا لەبەر بکات و
هەناسەیەک ببەخشێتە دڵە بەبەردبوەکانی زەمەن .
عارفانە پێناسەی زیکری گیابکات و
لەماناکانی وەرزی وەرینی گەڵابگات .
حەرفەکانی (با) بنوسێتەوەو
سەمایەک لەگەڵ دەستنوێژی گۆرانی بکات و ،
باران بگرێتە ئامێزی .
جەخار ... جەخار
زەمەنی دڵە بەبەرد بووەکانە
عەشق دۆڕانی ئەبەدی باخچەو پەپوولەیە
عەشق گریانی دوای کارەساتی وەرینی گەڵایە ...
خەون بەگەڕانەوەی زەمەن
هەڵوەشانەوەی توخبی ئاوەو
تێکەڵ نەبوونی توخمەکانە لەگەڵ (با) .
دەست بەردانی زاهیدە لەتەوافی گوڵ و
فڕینی نەورەسەکانە بەژێربارانی نائومێدی دا ...



لەوسەریشەوە عارفەکان
دەست بەرداری زیکری شەوانی گوڵ بوون و
ڕوویان کردە بارەکانی زەمەن ...
تالەگەڵ کچە سۆزانیەکاندا
شەوێکی عاشقانە ببەخشنە خەونەکانیان ...
ئای کەگێل بووین بەسروتەکانی ژیان ،
پەنامان بۆ تەفسیرەکانی قەدەر برد.
ئێمە لەزەمەنی سەهۆڵ بەندانی ڕووح دا
خۆزگەمان بەپاساریەکان برد ،
تاوەک ئەوان بێ پەروا بفڕین و
ماڵی خۆمان ببەخشینە گوڵ و باخچە ...
دڵمان بکەینە ماڵی عەشق و
لە خۆشنودی جێژواندا سەراسیمەوحەیران بین ...
ئای زەمەنی شومی ڕیازیات
وانەکانی لێتێک داین و ژمارەکان هەموویان سفربوون .
هیچ مامۆستایەک ئینشای پێ لەبەر نەکردین
هیچ عارفێک فێری زیکری عەشقی نەکردین ،
تابەکامی دڵ ژیان ئەزبەربکەین ...
حەرفەکانی عەشق ببەینە پەرستگای دڵ و
جۆگرافیای زەمەنی دڵی بەبەرد بوو ،
لەوەسیەتەکانی حافزێک دا هەڵگرین و

هەناسەی ژیان بەبەری

دڵە بەبەرد بووەکاندا بکەین ...

تەمی سەرگەڵاکانی بەیانیان لابەرین و

لەگەڵ ئاونگەکان ماچی گوڵ بکەین ...

سلێمانی 2006/12/29

* مەبەست ئەفسانەی سیزیفە



## قەسیدەی دووەمی دڵێک لەبەرد ... !!

ژیان عەدەمێکە پڕلەئەفسون

هیچ فەلسەفەیەک بۆی شیکارناکرێ .

قەدەر هێمای بوونی ئێمەیە

هیچ عارفێک تەفسیری پێ ناکرێ و،

هەمووومان لەئاستانەی نەبووندا

بەشوێن وەسێتەکانی بووندادەگەڕێن ،

لەوسەریشەوە بەدەستی بەتاڵ دەگەڕێنەوە ،

بۆنێوماڵەکانی عەدەم ...

فەلسەفەی ژیان مانایەکی پێ نەبەخشین ،

تابەشوێن گەڕانەوەی بووندابگەڕێن ...

ئێمە هەرگیز ڕەنگەکانی ئاوێزەمان نەناسی ،

تالەماناکانی تیشکی خۆربگەین .

ئەودەمانەی لەگەڵ بەردئاشنابووین

باخچەکانی ژیانمان وێران کردو ،

مەستانە ئاوێزانی جۆگرافیای ئاوبووین

دەست بەرداری فەلسەفەی (با) بووین و،

هەموو یاساکانمان بەخشیە دەستی مەستێ ،

ئەویش هیچ وانەیەکی فێرنەکردین ...

تاخەون بەپێکی شەرابەوە ببینین و ،

شەوێک لەعەشق ببەخشینە دڵمان ...

ئای زەمەنی نەبوون لەبووندا ،

چ قەدەرێکە دیوارێک لەبەرد ژیان بێت و ،

باران حەرفێکمان فێرنەکات .

با هەناسەیەکی ئومێدمان نەداتێ ...

عەشق نەمان باتەوە بۆ ئەوێ ،

بۆدنیای جاویدانی و خۆشنودی ...

تاسەمایەک لەگەڵ ڕوح بکەین و

زاهیدانە زیکری مانگ ببینین ...

ئای زەمەنی بەرد

هەموو تەجەلاکانمان بێ هودەیە .

دەریا لەمێژەوە گۆڕستانی ئەستێرە ماسیەکانە و ،

باخچە زیندانی کەناریەکانی عەشق و ،

کەنیسە شوێنی ڕاهیبە سۆزانیەکانە ...

هیچ عارفێک ئەوەی فێرنەکردین ،

گەڕان بەشوێن خلودو عەشق دا

دۆڕانی پێکی شەرابە لەشەوێکی مەستی دا ...



ئەفسوس ... ئەفسوس

لەبەردەلاّنی ئەم زەمەنەدا ،

هەمووگەڕانەکان بێ هودەیە

خەون قەدەری دەستی سۆزانیەک بوو ،

لەشەوێکی پڕلەزەت دا بەخشی بەمانگ و ،

هیچ زاهیدێک گومانی نەکرد

کەئەوە دواین ئاوابوونی باخچەیەو

دۆڕانی ماناکانی عەشقە ...

ئیدی کەس نامانباتەوە بۆئەوێ ،

تاکوچەکانی ژیان ئەزبەربکەین ...

ئای چی گێلیەکە کەچاوەڕوانی بوون بکەین ،

کەژیان لێوانلێوە لەتەلسمەکانی نەبوون .

لەجوگرافیای بەردا ،

پێناسەیە بۆئاو نەماوە .

لەتەوافی سۆفی دا ،

سروتێک بۆعەشق نەماوە ...

ئیدی نزاکان بێ هودەیە

هەموو سۆنگەکان ئاوابوون .

ئای زەمەنی دۆڕانی عەشق

چ یاریەک بەڕوحمان دەکەیت و ،

هەناسەی ئومێدت لێسەندینەوە ...

تالەفڕینی کۆترەکان نەگەین و

گوێ لەگریانی وەرینی گەڵای پایز نەگرین ...

ئەمێستا ئەلف و بای ژیان

بەدەریا پێناسە ناکرێ

هەموو خەونەکان وەهمی قەشەیەک بوو ،

لەشەوێکی پڕلەبێزاری و لەزەتدا

دایەدەستی سۆزانیەکی ئاڵۆشاوی و بردی ...

ئیدی چۆن شیکاری ئاوبکەین ،

کەهیچ مامۆستایەکی زیندەوەرزانی فێری ،

ناسینی ڕەنگەکانی گوڵی نەکردین

تابۆوێرانەی باخچەکانی مووحبەت

پرسە لەگەڵ پەپولەو کەناریەکان بگرین ...

قەدەر هەموو وانەکانی لێ تێک داین و ،

نەمانزانی کام ئینشای ژیان لەبەر بکەین ،

تاپیتەکانی عەشق حونجە بکەین ...

ئای حەواکانی بوون و نەبوون

ئێوە مێژووی بەردتان درووست کرد .

ئێوە* جەنگیزتان فێری خوێن کرد ،

لەوسەریشەوە یاریتان بەفەلسەفەی عەشق کردو ،

هەموو شەڕەکانی دنیا زادەی دڵی ئێوە بوو ...

لەئاستانەی ئێوەدا شوێنێک بۆژیان نەماوە ،



تانەوڕەسەکان سەماتان لەگەڵ بکەن .

دڵی سوتماکیکۆترەکان بکەونەوە لێدان و

کەناریەکان سەمفۆنیاکانی عەشق بژەنن ...

بێ هودەیە لەیەکەمین ساتی بوونەوە

حەواکان دیواری بەرد دروست دەکەن ،

تاساتەکانی لەزەتیان کۆتایی نەیەت ...

جەخار ... جەخار

ئێمەلەئەزەلەوە فێری ئەویاریە بووین

خەونەکانمان پێ ئەزبەرناکرێ و ،

فەلسەفەی بەردمان بۆشیکار ناکرێ .

تالەقامەتی عەشق بگەین و

نەفرەت لەفێلە وونەکانی حەوابکەین ...

ئای چیگێلیەکە ئەسرین بڕێژین و ،

لەبێ مانابوونی زەمەنی بەرد تێنەگەین

دۆڕانی یەکەمینی باخچەکانی عەدەن لەبیربکەین ....

سلێمانی 2006/12/9

* جەنگیز – مەبەست جەنگیز خانە

## هەناسەیەک بەرلەمردن ...!

قەدەری ئێمە نەبوو لەدایک بووین
لەشەوێکی نهێنی دا ...
ئارەزوە شەهوانیەکانی پیاوێک هێنانیە بوون و،
فڕێ داینە تەمەڵخانەی ژیان .
بەدەست خۆمان نەبووفێری ئەلف وبای خەوون بین و
یاری لەگەڵ قەدەری خۆمان بکەین .
کارەساتە ... کارەسات
بەبێ بوونی خۆمان بێینەگۆو
یاری لەگەڵ خەونەکانمان بکەین .
جەخار تازە ئاشنا بووین
ئیدی کەس پەی بەناخمان نابات و ،
گوێ بۆڕازەکانی دۆڕانمان ناگرێت.
خۆمان تەنیاین ... تەنیا



هیچ کەس نامانباتەوە سەر لەدایک بوون
هەموو ڕێگاکان بەرەو مردنمان دەبات .
قەدەری ئێمەیە گوێ بۆ درۆکان بگرین و،
بەپێکەنینی درۆزنانەی ژیان خەنی بین .
ئەوە دۆڕانێکە لەئەزەلەوە ئاشنایە بەرۆحی ئێمە .
ئێمە ئەلف و بایەک لەخۆشەویستی فێرنەبووین
ڕۆژانە لەگەڵ فیراق گەمەدەکەین و
مەستانە باسی خەونە جاڵجاڵۆکەیەکانی عەشق دەکەین ،
بەبێ ئەوەی خەونمان هەبێت و
لەمانای فڕینی پەپولەکان بگەین .
ئای کەگێل بووین دڵی خۆمان دایە دەست ،
قەدەری ئەم ژیانە دڵڕەقەی عەشق تیایدا وونە و
زاهیدانە عاشق بووین .
ئێمە نەمانزانی ، لەدرۆ عەشق ناکرێ .
خەیاڵدانی ئێمە بێ عەشق لەدایک بووە
ڕۆژانە درۆدەکەین
کەس هێندەی ئێمە لەگەڵ درۆ ئاشنا نیە و،
هەموو ڕاستیەکانمان لەناخماند نغرۆ کردوە و
مەستانە بەدوای دواین پێکی خۆشنودی گەڕاین
وەلێ ژیان سەرابی نیشان داین .
ئای کەنەزان بووین

بەشوێن نیگا فێڵاویەکان کەوتین و
ڕۆژانە نیگای درۆزنانەمان دەگۆڕیەوە
لەوسەریشەوە بەبەتاڵی گەڕاینەوە .
ئای چی زەمەنێکە
پایزو گەڵا بەبێ یەک بژین و
خەندەی سەر لێوی ئێواران ،
لەتارمایی بچێت و
دڵی شارێک شەقار بکات و ،
ماڵێک لەدرۆ دروست بکات .
ئەوە چی قەدەرێکە
پایز سەمفۆنیایەک بەوەرینی گەڵاکان دروست نەکات و
ژیانمان ببێتە کارەسات و
جەستەی بێ عەشقمان بەدوای زەمەندا بەکێش بکەین ..

2006/10/15



## نامەیەک بۆ مەعشوقەکەم ... !!

سترانێك لەخۆشنودی و ،
باخچەیەك لەگوڵی ئەرخەوانی .
دەریایەك لەڕوانین و گۆرانیەك لەموحیبەت
داستانێك لەعەشق و پایزێك پڕلەماچ ،
بۆبەرپەنجەرەکەت بەجێ دەهێڵم .
دەریایەك لەخۆشەویستی ،
بۆتۆی دواساتەکانی پەرستن بەجێ دەهێڵم .
دڵی من دەزانی نوسینی نامەیەك بۆجوانترین مەعشوق ...
ووشە لەئاستیا کۆیلەیە و ،
ناتوانێت گوزارشتێك بێت لەحەقیقەتی ناخم .
کاتێك عەشق دەبێتە سەرمایەی روح و،
بەنێو کۆی هەست و نەست و خوێن دا بڵاو دەبێتەوە .
ئیتر چۆن ووشەدەتوانێت ببێتە زمانحاڵی ئەو عەشقە .
ئای کەبێ مانایە ووشە بتوانێت گوزارشت ،
لەخەونی دووعاشق بکات ...

تەنها هەناسەو ئاوێزان بوونی روحەکانن ،
دەتوانێت لەمانای عەشق تێبگەن .
هەروەك چۆن پایز لەمانای سەمفۆنیای وەرینی گەڵادەگات .
هەروەك چۆن ماسی لەنهێنی دەریا دەگات ،
یان گوڵ لەماچی ئاونگی بەیانیان ،
یان ئەستێرە لەتریفەی مانگ ...
ئاوهاش تەنها دوو عاشق دەتوانن ،
لەمانای روح و عەشق بگەن ...
تۆ لەئاستانەی عەشق دا ،
بوویتە خواوەند و ،
پاکیزەیت بەسەر بەیانی دڵم دا پەخش دەکرد .
هەموو سەحەرێك ،
لەوسەری کەنارەکانەوە بۆنی هەناسەت دەکەم و،
بەهێواشی ئاوێزانی روحت دەبم ...
بەنەورەسەکان دەڵێم ئاگاتان لەروحم بێت ،
قەت بیرلەوەنەکەنەوە لەخەونی قوڵی سەرمەدیانەی عەشق خەبەری
بکەنەوە .
بەکۆترەکان دەڵیم ،
ئاگاتان لەدڵی من بێت ،
ئەو بەسەفەرێکی عاشقانە پیاسەیەکی ئاسمان دەکات و،
دەیەوێت دەست لەملی مانگ و ئەستێرەکان بکات ،



ئێوە لەنگەری بگرن،
بابەوپەڕی خۆش نودیەوە باڵەفڕێ بکات و،
ئەو سەماجوانەی دەیەوێت بەروح با بیکات ،
ئێوەی لەگەڵ بن ...
بەکەناریەکان دەڵێم ،
ئەمڕۆ مەعشوقەکەی من میوانی خوانی چڕینی سەمفۆنیاکانی
ئێوەیە ،
بیر لەوە نەکەنەوە واز لەخوێندن بهێنن .
چونکە ئەو مەعشوقە زەمەنێکە لەعەشق دابڕوە ...
سی و چوارساڵە بەبێ عەشق ژیان دەکات .
سی و چوار ساڵە دڵی بوەتە میوانی سەراب و لەتەنهایی دا ژیان
دەکات .
تازە بەتازە گەیشتۆتە ئاستانەی عەشق و،
دەیەوێت ئاسودەبێت بەچڕینی سەمفۆنیاکانی ئێوە ...
بەباخچەکانیش دەڵێم ئەمڕۆ دڵم دەنێرمە میوانی ئێوە ،
تابەکامی دڵ بۆنی گوڵەکان بکات و ،
لەژێر سێبەری دارکانتاندا
ژوانێك لەگەڵ مەعشوقەکەی بەسەر بەرێ ،
ڕێگەمەدەن باخەوانە تورەکان هەراسانی بکەن
ئەو لەمێژەوە نەچوەتەباخچەکانی عەشق و ،
مەعشوقەکەی لەئامێز نەگرتوە ...

چۆلەکە چاو بزەکان سەیری مەعشوقەکەم مەکەن ،

ئەولەمێژەوە چاوەڕوانی ئەوسەفەرە جاویدانیەیە ،

کەلێوی عاشقەکەی ماچ بکات و،

بەئارامی لەئامێزی دا ئۆقرە بگرێت ...

دەزانی ئەم نامەیە هەرگیز تەواو نابێت

ووشەکان زۆرکورتن لەئاستی نووسین دا

ژیان زۆر کورتە لەچاو عەشق دا ،

ئەی جوانترین مەعشوقی ئەم سەر زەمینە .

هیچ ڕۆمانێك ناتوانێت بگاتە ئاستانەی عەشق .

هیچ شیعرێك بەبێ دڵی تۆ ناتوانێت بێتە بوون .

ئەزانی ئەم جیهانە بەبێ مەست بوون لەعەشق دا،

بەبێ سەماکردن لەگەڵ روح دا ،

بەبێ ئاوێزان عاشقەکان ،

لەشەوێکی بەرتریفەی مانگەشەودا ،

هیچ مانایەکی نی یە ...

دەزانی ژیان کورتە ،

لەبەرئەوەی عاشقەکان ناتوانن هەناسەکانیان بەبێ کات بەسەر بەرن

،

دەزانی خەمی عەشق

خەمی ژیانە ...

زۆرن ئەو عاشقانەی بەدیارمانگەوە ،



تابەیانی چاوەڕوانی هاتنی یاردەکەن و،

مانگیان لێ دەبێتە دەموچاوی دولبەرەکەیان و،

چاوەڕوانی ماچێك ،

لەئامێزگرتنێك ڕاموسانێك دەکەن ...

ئەوساتانەی عاشق زاهیدانە ،

لەبەردەم مانگ دا دەپارێتەوە ،

تابێتەبەردەمی و ئەمیش لەئامێزی بگرێ ...

ساتەکانی گەیشتن بەعەشق زۆر گرانە

دەزانی عاشق بوون پیاسەیە لەگەڵ روح و،

ڕاژەنینی هەستەکانە ...

دەزانی ، وەك ئەوپیانۆژەنەوایە ،

کەدەیەوێت بەشوێن جوانترین پارچە مۆسیقادا بگەرێ ،

بۆئەوەی ژێیەکانی روحی پێ ئاوبدات .

یان ، وەك ئەوگوڵەوایە ،

کەلەقۆزاقەدایە و بەشوێن تەواوبوونی وەرزی زستاندا دەگەڕێ ،

تاجوانترین نمایشی خۆی بەرەنگەکانی بکات .

یان وەك ، ئەو ئاوێزەیەوایە بەدوای ساتێکدا دەگەڕێت ،

لەبەهاردا باران خۆش بکاتەوە و ،

ئەویش ڕەنگەکانی خۆی بەئاسمانی جواندا پەخش بکات و،

دڵی مرۆڤەکان بۆلای خۆی ڕابکێشێ و سەرسامیان بکات ...

ئەمێستاش زۆر گرانە من بتوانم ،

لەرێگەی ئەو ووشانەوە پێناسەی عەشق بۆ تۆبکەم .

دەزانی هیچ سۆفیەك ناتوانێت پێناسەی عەشقی خۆی بۆ خودا بکات

.

منیش ناتوانم پێناسەیەك بەعەشقی خۆم بۆ تۆ ببەخشم .

دەزانی مەستانە عاشقت بووم و،

زاهیدانە یاری لەگەڵ روحت دەکەم ...

کێ دەتوانێت لەزمانی عەشق بگات ،

جگە لە عاشقان خۆیان .

ئەستەمە مرۆڤـــ بتوانێت پێناسەی روح بکات .

دەزانی ( خەزان ) ، بۆکەس ناتوانێت پێناسەی بکات ،

چونکە ئەو دووعاشقە خۆیان ،

سەماکانیان ئالودەبوونیان ،

لەئامێزگرتنیان ...

هەریەکەیان پێناسەیەکن و،

مۆرکی ساتێکی جوان و زاهیدانەن ...

ئیدی چۆن بەوشەیەك پێناسەی عەشق دەکرێ ...

تا دوو روحی عاشق بەردەوام بێت ،

کانیاوەکانی ئالودەبوون بەردەوام دەبێت و ،

ئاوی سازگاریان لێ دەچۆڕێ  و ،

پێناسەکان زیاد دەکەن ...



تائەو ساتەی ژیان بەردەوام بێت یاری لەگەڵ تریفەو مانگ دەکەن و

،

گوێ بۆچڕینی سەمفۆنیاکانی کەناریەکان دەگرن ،

پیاسەی ناوباخچەکانی خۆشنودی دەکەن ...

( خەزان ) ی من عەشق گەیشتنە بەلوتکەی جوانی و ژیان .

گەیشتنە بەساتەکانی فڕین .

ئالودەبوونە بەسەمای روح و،

گەڕانە بەنێو ئاسمانی جوانی دا ...

ئەم نامەیە هەرتەواو نابێ ،

ئەم نامەیە گەڕانە بەنێو بەهرە جوانەکانی عەشق دا .

گەڕانە بەنێو ساتەکانی موحیبەت و خۆش نودیدا ،

یاری کردنە لەگەڵ روح و ئەندێشەدا ...

دەزانی یەکەمین ساتی عاشق بوون کردنەوەی دەرگاکانی ژیانە .

دەزانی کۆتایی نامۆیی و سەراب و ئازاردانە .

ئەودەمەی دڵی من ئالودەی دڵت بوو ،

روحمان ( خەزان ) ، هەزاران ساڵ بوو ئاشنای یەکدی بوون ...

دەزانی یەکەمین جارگوێ بیستی دەنگت بووم ،

بەڕاستی ئەودەنگە بەڕوحم ئاشنابوو ...

ئەوسەرەتای سەفەری جاویدانی روح بوو .

ئەوسەرەتای گەیشتن بوو ،

بەساتەکانی گەڕانەوە بۆژیانی نەمری و ،

گەڕانەوە بۆناو ڕەنگە پەمەییەکانی عەشق و،

ئاوێزان بوونی روح ...

ئەوسەفەرە جاویدانیەی منی گەڕاندەوە بۆدنیای منداڵی .

ئەودنیایەی هەمووشتەکان تیایدا بێ گەردن ،

دنیایەك ، لێوان ... لێوە ،

لەخەونی جوان و خۆشەویستی ...

دەزانی ( خەزان ) ، عەشق گەڕانەوەیە بۆپاکێتی و منالّی و بەرائەت

.

دەزانی کاتێك منالّ حەزی لەشیرەو ورك دەگرێ ،

تاتێر لەشیری مەمکی دایکی نەخوات ئاسودە نابێت ،

دوای تێربوون پێدەکەنێ ...

دەزانی عەشق هەمان گوزارشتە و ،

عاشق ورك لەمەعشوقەکەی دەگرێ ،

تاماچی لێوانی بکات ،

ئەوسا لەئاوێزان بوونی دا نوقمی خۆش نودی دەبێت و ،

دەچێتە خەوێکی قوڵی مەستانە ...

دەزانی عاشق بەچاوی دڵ چاوەڕوانی ژوانی مەعشوقەکەی دەکات ،

هەموو وێنەکان دەبنە مەعشوقەکەی و،

سەما لەگەڵ ئەندێشەو روح دەکات ،

یان شەوانە خەونەکانیەوە ،

چاوەڕوانی هاتنی مانگ دەکات ...



دەزانی ( خەزان ) ، لەوساتەوەی تۆ دڵ و رحت بردوم ،

بەردەوام ئەندێشەم لەلای تۆیەو چاوەڕوانی هاتنت دەکات .

ئیستا ساتەکان لەلای من هەموویان یەکن ،

زەمەن لەزاکیرەی مندا بوونی نەماوە ...

ئەوەی منی بەستوەتەوە بەژیانەوە ،

تەنهائەوساتانەیەکەتۆی تیایت و ،

سەمالەگەڵ روحم دەکەیت و ،

دەم بەیتە دنیای مەستی و فانی عەشق و ،

سەما لەگەڵ روحم دەکەیت ...

رۆژانە نەورەسەکان دەکەیتە میوانی دڵم و ،

هێزی ⭑ ئۆرگۆنم پێدەبەخشی ...

دەزانی بەدەر لەعەشق ژیان بێمانایە .

ژیان کارەساتە،

گەرمرۆڤــ دورلەسۆزو عەشق بژی ...

ژیان کورتە ،

دەزانی هەرکاتێك شیعرێك ،

یان ڕۆمانێك دەخوێنمەوە تولەلامیت ،

دەڵێت ئەوە دڵی من چی دەخوێنیتەوە ،

باسی چی دەکات ،

هەندێك جاریش زۆر بەهێمنی لێوەکانت دەهێنی وماچم دەکەی و ،

دەڵێت ماندوونەبیت تاقانەی دڵم .

هەندێك جاریش ورِك دەگری و دەڵێت ،
دەبێت بەدەنگی بەرز بیخوێنیتەوە با روحم بەدەنگت ئاسودەبێت ...
هەمیشە دەڵێم هەناسەکەم هەموویان بۆتۆیە ،
هەناسەکەم هەموو پاڵەوانەکانی عەشق تۆیت ...
تۆ * کچەی پرتەقاڵ ،
تۆ * نوشافرینی ، تۆ ... تۆ ....
خودای هەموو عەشق و رِۆمانەکانی ،
تۆ عەشقی هەموو شیعرەکانی ،
جارێکی تر دەڵێت :
دەباسی * ئۆدیبی پاشام بۆبکە ...
دەزانی هەموو پرسیارەکان مانگ دەبزوێنن ،
هەناسەکان دەبەنە دنیای مەستی و عەشق ،
لەناکاو دەڵێت :
هەناسەکەم بەیانی سەفەری مەرگ ،
کەرکوك خۆناکەی :
باسی کچەی پرتەقاڵم بۆبکە ...
ئای ( خەزان ) ی دڵم ،
دەزانی عەشق لەچوارچێوەی هەندێك نوسین و،
لاپەرِەدا جێگای نابێتەوە :
ئاخر سەفەرەکانی عەشق ،
بە هیچ زاهیدێك تەفسیرناکرێ



یادەوەری و خۆشنودی و موحیبەت هێندە زۆرن ،
بەردەوام لەبەردەم نوسینەوەی دا ،
سەفەری کەنارە دوورەکانی رِوح دەکەم و،
خەون بەحەقیقەتی گەیشتن بەلوتکەی عەشقی تۆوەدەبینم ،
دەزانی رِەنگە ئەوعەشقە سەرئەنجام دنیایەك ئازاربێ .
دنیایەك بێ هیوا بوون ،
ئاخر گەر عەشق نەبێتە فریاد رِەس و ،
پاسپۆرتی گەیشتن بدات لەروح ،
ئیدی کۆتایی هەموو شوناسێکی جوانی دەبێت و ،
عەشق دەبێتە وەهمێك و ،
خۆمان بەدەستی خۆمان سەری دەبرِین ...
ئای کارەساتە مەعشوق بەدەستی خۆی ،
باخچەکانی عەشق سەربڕێ و
ماڵی دڵ بکاتە وێرانە ...
هەموو وێنەجوانەکان سیاچاڵ بکات و ،
عاشق بەتەنهایی و نامۆیی بسپێرێ ...
ئای ( خەزان ) ، دیسان ئەم نامەیە تەواو نابێت ،
زاکیرەم رِێگەم نادات ،
ئیدی پێناسەی عەشقم بۆتەواوناکرێ ...
دەزانی دەروازەی گەیشتن بەماڵێك لەعەشق ،
دنیایەك ئازار هەڵدەگرێ :

دەزانی دنیا بەبێ عەشق مردنێکە لەتەنهایی دا ...

دەزانی لەکاتی ئەم پەیڤانەدا زاکیرەم دەمباتەوە بۆلای ،

بۆسەرەتای بوون و جوانی و عەشق ...

ببورە هەناسەکەم ناتوانم ئەم نامەیە تەوابکەم :

لێرەدا دەبێت بوەستم و بڵێم :

( خەزان ) ئەم نامە جاویدانیە تەواو نابێت ،

تاهەناسەکانی زاهید لێبدات و،

سۆفی نزا لەعەرشی خودابکات ،

عەشق کۆتایی نایەت ....

سلێمانی 24-2006/10/30



تێبینی :

-1

٭ کچەی پرتەقاڵ : مەبەست لەرۆمانی( کچەی پرتەقاڵی) نوسینی (یوستان گاردەر) ، وەرگێڕانی بۆکوردی ( بەهرۆز حەسەن )

٭ نوشافرین : مەبەست لەپاڵەوانی ڕۆمانی ( ساڵی ئاشوب ) نوسینی (عەباسی مەعروفی) وەرگێڕانی بۆکوردی ( محەمەد کەریم )

٭ ئۆدیب : مەبەست لە پاڵەوانی شانۆگەری ( ئۆدیبی پاشا ) نوسینی ( سۆفۆکلیس) وەرگێڕانی بۆ کوردی ( کاکەی فەلاح )

-2

ئەم نامەیە ، ڕاستە وەك تێکستێکی ئەدەبی نوسراوە بەڵام بۆکەسێك نوسراوە کەتەنها خۆی لەماناکانی تێدەگات و من جگە لەنامەیەك بۆ مەعشوقەکەم ناتوانم هیچ ناوێکی ئەدەبی لێبنێم ، تەنها نامەیەکی عاشقانەیەو خوێتەر خۆی چی ناوێکی لێدەنێت

سەربەستە ، بەڵام ئەم نامەیە تەجەلای سۆفیە بۆ عەشقی خودا ، سروتەکانی عیرفانێکە بۆ ئاشناکردنی  سۆفی بەزیکری عەشق ، ناخی منە بۆ عەشق ..

**بەرهەمە چاپکراوەکانم :**

1- مەزهەبەکان چۆن لەژنان دەروانن      ساڵی  چاپ 1997

2- وەڵامێك بەرخنەخورافیەکانی ئیسلامیەك      ساڵی چاپ 1998  بەهاو بەشی لەگەڵ ئازاد مەحمود

3-سەرهەڵدانی ئیسلام و پێشێل کردنی ئازادی  ساڵی چاپ 1999

4- ئیسلام و ناسیونالیزم  مەسەلەی ژنان      ساڵی چاپ 2000

5- کۆمەڵێك وتار دەربارەی کێشەی ژنان  ساڵی چاپ 2002

6- عەشق و خۆشەویستی لەنێوان وەهم و واقیعدا  چاپی یەکەم ساڵی 2005

7- ڕوکاری ژن بەشداری سیاسی  بەهاوبەشی لەگەڵ  لەتیف فاتح فەرەج – ئاوات یاسین ساڵی چاپ 2006

ئەو بەرهەمانەی ئامادەیە بۆچاپ :

ئارمان  کۆمەڵێك گۆشەیە دەربارەی مافەکانی ژنان

ئەفسانە و عەشق بێهودەیی یان بەقوربانی بوونی پیاو

سێکس و ئەخلاق

لەزۆربەی گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بابەتی کۆمەلایەتی و سیاسی ڕۆشنبیریم  بلاو کردوەتەوە